# ✍بەناوی خوای گەورە و میهرەبان

خوێندکاری ئەزیز،من دەرچووی پۆلی ١٢م،من لەم نوسراوە کورتەیا،هەوڵ ئەیەم ئەو تەکتیکانە باس بکەم کە جێ بەجێم کردووە،وە لە ڕێگەیەوە توانیومە،نمرەیەکی باش بە دەست بهێنم،توانیومە کە ئاستی زانستی خۆم بەرز بکەمەوە،توانیومە کە ئارام بگرم لەسەر ئەو نارەحەتییانەی لەو ماوەی کە هات بەسەرمدا ،تەبعەن بە یارمەتی خوای گەورە.

✍چۆن سەر بکەوم؟ چ شتێک باشە بیکەم ؟خۆم لە چی بەدور بگرم ؟ هەوڵ ئەیەم،وەک چۆن لە بەرانبەرت دانیشتبم و بکەوینە قسەکردن پێکەوە تەواوی ئەو پرسیارانەی کە لەناخت هەڵدەقوڵێ،ببزوێنم،بەرچاو ڕۆشن بی بەو شێوازانەی کە دەتوانی تۆش وەک هەر کەسێکی کە،نمرەی بەرز بهێنی و شتەکەش ئاسایی بێت بەلاتەوە.

هیوادارم کە هەناسەیەکی قوڵ هەڵبمژیت و تەرکیزی تەواوەتیت لەسەر قسەکانم بێت و بە ناخت تێکەڵ بە قسەکانم بیت.

ئازیزی من،ئەوەی کە من لێرە دەمەوێ،ئامانجم مەبەستە،هۆشیارکردنەوەی تۆیە لە چۆنییەتی خۆ ئامادەکردن بۆ هێنانی نمرەی فوول لە هەموو وانەکان،نەک ئەوەی کە نمرەی بەرز بێنی بەڵکو،دەبێ تۆ ئامانجی خۆت دابنێی،بزانی بۆچی هەوڵ ئەدەی،وە بۆچی خۆت ماندوو دەکەی!!...

ئاخر مەعقول نییە کە تۆ هیوات وابێ کە تەنها٩٠ بهێنی و ڕۆژانە فول تایم سەعی بکەی،تەرکیزی تۆ و باش تێگەشتنت لەوانەکان،پەیوەستە بەو ئامانجەی کە دات ناوە،بەو شێوەیەی کە بیر لە داهاتووی خۆت دەکەیتەوە،دەکرێ کەسێ نیو ئەوەندی تۆ سەعی بکا و خۆی ماندوو بکا،بەڵام بەحوکمی ئەوەی ئیرادەی بەرزە و هیوای زۆرە،زۆر لە تۆ زیاتر دەهێنێ،بەڵام تۆ کە هیوات نزم بوو وە سەعیت لەو باشتر بوو،دەبینی کە لەو کەمتر دەهێنی،لەم کاتەیە لۆمەی خۆت نەبێ،لۆمەی هیچ کەسێکی کە مەکە،خاڵە لاوازەکانت باش بکەوە،گەر ڕۆژانە کاتێکی زۆرت بە ئینتەرنێت و ڤیدیۆی یوتیوب دەڕوا،وازی لێبێنە،واز لە چوونەدەرەوەی زۆر بهێنە،واز لە سەردانی زۆر بهێنە،نابێ لەم کاتەیە هەر میوانێکت هات،تۆ بڕۆی تەواوی کاتەکەت لەگەڵی بەسەر بەری،تۆ لێرە عوزرت هەیە،دڵنیابە کەسیان لێت عاجز نابن،وا گومانیش مەبە گەر تۆ نەڕۆیتە لایان،ئیتر دەمەتەقە ناکرێ و تۆش عەیبدار دەبی،یاخود باسی تۆ دەکا،کە تۆ سەعی دەکەی و ئەبی بە چاوەوە.

نا ئەوە هەڵەیە،وا بیر مەکەوە تۆ عوزرت هەیە،تەبعەن تۆ گەر بتەوێ بگەی بە ئامانجی خۆت نارەحەتی هەیە،کە دەبێ تێی پەڕێنی زاڵ بی بەسەر هەستت و عەقڵتی پێش بخەی،**ڕاستە لەززەتی جێ بەجێ کردنی ئەوەی نەفس و هەستت داوای دەکا،گەرما و گەرمە،بەڵام لەززەتی کردنی ئەو ئیشەی کە عەقڵت داوای دەکا،سەبری دەوێ تا دەگەی پێی و دوورە،بەڵام ئەوەت لە یاد نەچێ،کە ئەوەی کە عەقڵ لێت داوا دەکا بەردەوامە کە گەشتی پێی،بەڵام ئەوەی کە نەفست و حەزت لێی داوا کردووی و لەدووی ڕۆشتووی،کاتییە وە دواتر پەشیمانی بەدواوە دێ**،زۆۆۆ زۆۆۆر تاڵە و ناخۆشە و پەنجەی پەشیمانی دەگەزی.

دور بکەوە لە ئەخبار و حاڵ و باڵی وڵات،تۆ لازمە کە هەر شەهادەیەکت هەبێ،ئەملا و لای تیا نییە،وە دەشبێ یەکێک هەبێ کە نمرەی تەواوەتی لە هەموو وانەکان بهێنێ،کەواتە ئێسا ئەو کەسەیە لەناو ئێوەدایە،دەی با تۆ یەکەم کەس بی،کە ئەم پڕۆژەیە تەقدیم بکەی بۆ بەشی لاشعوری مێشکت.

ئازیزەکەم،بەشی لاشعوری مێشک هەتا زوو پڕۆژە تەقدیمی بکەی،باشترە و زووتر بەشی شعوریت چالاک دەبێ،واتە گەر تۆ هەر لێساوە دەست بکەی بە دانانی ئەم فکرەیە لە مێشکت،دڵنیابە،ئامانجی خۆت دەپێکی بە ئیزنی خوای گەورە،وە دوای تەقدیم کردنی ئۆڤەرەکە یاخود پڕۆژەکە بۆ مێشکت، دەبینی،کە جەستەت وردە وردە حەزی پێ دەکا،وە مێشکت داوای پلانت لێ دەکا بۆ گەشتن بەو پلەیە،بەو ئامانجە بۆ پێکانی،بە کورتی و کوردی،تۆش مەترسە و تواناى مێشکت بەلاواز مەزانە،هێشتا زووە بۆ ئەوەی دەست پێ بکەیت،چییە تەنها ٣٦٥ ڕۆژە،دڵنیابە دەڕوا ئەو کاتەت،گەر بە بەتاڵی بێ هەر دەڕوا،وە گەر بە پلان و ئیشی باشەوە بێ،هەر دەڕوا،بەڵام ئەوەی دووەم بەرهەمی هەیە ئەوەی یەکەم نییەتی،ئەوەی یەکەم کە بە بە تاڵیەوە دەڕوا خەریکی هیچ شتێک نیت،نەفست زاڵ دەبێ بەسەرت و تواناکانت لاواز دەکا وبۆ لای شتی خیلاعی دەتبات،بە کورتی هەوڵ دە کە کاتی بەتاڵیت کەم بێ،وە ئەو ماوەشی کە بەتاڵی،بە بیر کردنەوە لەو لەحزەی کە دەگەی بە ئامانجی خۆت، پڕۆژەت چۆن دەبێ،مەسەلەن تۆ دەتەوێ کە ببی بە ئەندازیار،ئەبێ وا بیر کەیتەوە لە ڕێستەکانی سەعی،کە تۆ وا خەریکی پڕۆژەیەکیت،وا خەریکی و سەر لە مقاولەکان ئەدەی بزانی خەریکی چین،گەشتووە بەکوێ ئیشەکەتان،تاوەک لەو

ماوەشی کە بەتاڵی،بیر لە شتی پڕوپووچ نەکەیتەوە،دەبێ کەسێک هەبێ بەردەوام،یارمەتیت بات و تەشجیعت بکا،هەر کە تووشی بێ تاقەتی بوویت،داوای لێ بکەی کە هەنێ قسەت بۆ بکا و ماندوی گیانت دەرچێ.......

پۆلی ١٢ لەو ڕۆژەوەی،کە تۆ پۆلی ١١ تەواو دەکەی،کارت وەردەگرییەوە،دەست پێ دەکا،هەتا کۆتا تاقیکردنەوەی ساڵی دواتر،بۆیە وریابە،کە مانگی ٩ دەست پێ ناکات،پلانت هەبێ و خۆت بناسە بزانە لە چ وانەیەک ئاستت باش نییە دەورەی بکەوە،وە هەوڵ بە هەر لە هاوینەوە،زۆر بەی مەوزوعات تەواو بکەیت شتێکی زۆر باش دەبێ،وە هەوڵ بە ببە کەسێک کە جێی ئومێدی مامۆستاکانت بی، وە هەر تاقیکردنەوەیەکتان کرد، هەتا ئەتوانی خۆت ماندوو بکە و هەوڵ بدە کە فوول مارک بهێنی،**تکایە تکایە تکایە**،مەڵێ ئەبم بە چاوەوە،بەردەوام پەیوەندیت لەگەڵ خوای گەورە هەبێ و داوای لێ بکە کە بتگەیەنێ بە ئامانجی خۆت،وە نەک تەنها مانگی جارێک یاخود هەفتەی جارێک، هەموو وەقت و سەعاتێک داوای لێ بکە،لەکاتی نان خواردن،لەکاتی چوون بۆ خولی هاوینە،لەکاتی پێش خەوتن،خەونی پێوە ببینە،بڵێ خوایە بمگەیەنە پێی،وە خێری نەبڕاوەشم بۆی تێبکە،واتە لێرەیا هەم تۆ دەگەی بە ئێشەکە وە هەم خوای گەورەش خێری دونیا و قیامەتی نەبڕوات بۆی تێدەکا،بۆیە مەترسە و بدوێ لەگەڵ خوای خۆت،شەرمە لەوکاتەش کە تۆ داوای شتی گەورە نەکەی،بۆ؟ ئەزانی تۆ لە کێ داوا ئەکەی ؟خوای جیهانیان هەموو شتی لەژێر دەستە،هەموو شت مێشکی تۆ،دڵی تۆ،هەستت،عەقڵت،بیر و بۆچوونت،داوای لێبکە کە یارمەتیت بات و خێر بکاتە ئەو بەشەوە کە حەزت پێیەتی و وە خێری

نەبڕاوەی قیامەت و دونیای تێبکا،هەمیشە ئەبێ لەو خەیاڵەی دەیکەی،پاک بیت،نەک بۆ ئەوە تۆ پلەی بەرز بێنی تاوەک فلان و فیساری پێ لەکەدار بکەی یاخود پۆز بەسەر فلان و فیسار هاوڕێت لێبەی،هەڵەیت هەڵەیت،ناشگەی پێی،بۆیە وریابە....

پاشان دەورەکانت بە باشی دەکەی،هەوڵ بە کە هەر پرسیارت هەبوو هەمووی بنوسی لە مامۆستای بکەی،تکایە تکایە شەرم،مەکە لە مامۆستاکە هەرچی پرسیارت هەبوو بینوسە لای خۆت و لێی بکە،یەک هەڵبژاردن بۆ تۆ زۆۆۆر زۆۆر گرنگە،وە گەر بشتوانی مەوزوعی هێنانی نمرەی بەرز لای مامۆستایەکت کە تەواو سیقەت پێی هەبێ،باس بکەی،زۆر باش دەبێ،پاشان مەرج نییە کە هەموو ڕۆژەکە،سەعی بکەی لە دەورە هاتیتەوە عادەتەن نیوەڕۆیە خەو خۆشە،بخەوە هێور هێور دواتر بۆ عەسرەکەی قوڵی لێ هەڵبماڵە و هەمووی حەل بکە،یەک شتت بیر نەچێ،دەبێ لەسەر وەرەقە سەعی بکەی تێ دەگەی لەسەر وەرەقە سەعی دەکەی،واتە کتێبەکە لای خۆت دادەنێی هەر شتێک دەزانی گرنگە،لەبەری بکە پاشان هەوڵ بدە بینوسەوە،کاتێ لەبەر کردن دەکەی،هەوڵ بدە کە وێنا بۆ لەبەرکردنەکە بکە وە بینوسەوە ،وە گەر چەند خاڵێک هەبوو،دەتویست کە هەمووی لەبەر بکەی،دەتوانی کە کلیلی وشە بەکار بهێنی،وە هەوڵ بە مێز و کورسیت لابێ،ئەو ژورەی کە سەعی تیا دەکەی بێ دەنگ بێ،ئینتەرنێت و خەت و فەیسبووک و تەلەفزیۆن و فیلم و تۆپی پێ ئەم ماوەیە خۆتی لێ بپارێزە،بەڵام ئاساییە لە هەفتەیەکدا جار جار سەیری یارییەک بکەی،بەڵام وریای ئەوە بە کە سەیری هەواڵ و ئەو شتانەیە مەکە،بەو وەزعەی

ئەمڕۆ بڕیار لەسەر هیچ شتێک و داهاتوو مەدە،موچە هات نەهات بەغداد و هەولێر گەشتنە ڕێکەوتن یاخود نا ئەمانە هەمووی وەلاوە بنێ،مێشکی خۆتی پێوە سەرقاڵ مەکە،چونکە تەنها ساردت دەکاتەوە لە هەوڵ دان و خۆ ماندوو کردن،هیچی کە، با بەردەوام ئاو یا شیرینی یا شەربەت و خورما یەکێ لەمانەت لەلا بێ و جار جار بیخۆرەوە یاخود میوەیە گەر حەبی ڤیتامینەکەشت دەست بکەوێ شتێکی زۆر باش دەبێ،دواتر بۆ بیرکاری و ئەو مەوزوعاتانەی کە حەلکردنیان هەیە تۆ دەبێ لەسەر وەرەقە بیکەی.

دواتر هەوڵ بدە کە هەمووی لەسەر ئەو وەرەقانە حەل بکەی،بە باشی و چاکی،نەکەی نەکەی هەرگیز بە چاو نمونە حەل بکەی و بڵێی دەیزانم،هەڵەیە هەڵەیە هەڵەیە،زەڕبەی کوشندەیە،دەبێ لەسەر وەرەقە بە ئیسراحەتی خۆت بیکەی،نەڵێی کات دەبا،چونکە ئەوە هەڵەیە،ئەی تۆ ئیشت چییە؟نەم وت پلانەکەت،بریتییە لە پێکانی ئامانجت،کە ئاماژەم پێ داوە چ شتێکە،دواتر ،پشت دەبەستی بە مەلزەمە،هەنێ هەیە دەڵێ بەکاری مەهێنە هەمووی کتێبە،بابە هەڵەیە،دەبێ مەلزەمەت هەبێ،ڕێبەری و کتێبی وانە و حەلی پرسیارەکانی کتێبەکە،بۆ هەموو وانەکان،وە سەیر کردنی پرسیاری وەزاری، بەس ئەمە لە کاتی دەوام،دەکرێ لەسەرەتایی دەست کردنت بە دەورە،هەست بکەی کە قورسییەکی زۆرت لەسەرە،مەترسە ئەوە ماوەیەکە دەڕوا و نەجاتت دەبێ،زاڵ بە بەسەریدا،هەمیشە خۆت دڵنیابکەوە کە بە ئیزنی خوای گەورە سەر دەکەویی وە داوای سەرکەوتنیش لەخوای گەورە بکە،مێشکت لەسەر ئەوە بخەوێنە لێی،هەوڵ بە بۆنی خۆش لە کتێبەکانت بە،با هەمیشە بۆنی خۆشیان لێ بێت،ئەو

بۆنەی کە حەزت پێیەتی،ئەوەی لێبە،گەر بێ تاقەتیش بووی هەر ئەوەنەی کە نزیکت بوون و بۆنەکەی هات بەسەرت شەیدای دەبی،وە قسەی کاریگەر با هەبێ لەسەر تاکەکەت،بۆیە گەر ماندووش بووی و نەتوانی سەعی بکەی یا بێ تاقەت بووی،تەنها بەسەیر کردن و بینینی ئەو هەموو قسە بەجۆشانەیە،ورەت بەرز بێتەوە،لەو شوێنە دایبنێ،وە لەسەر کتێبەکانت،وە بە دیواری ژورەکەت،گەر ژورێک هەبێ بۆخۆت لەو ماوەیە،زۆر زۆۆر باشە، بگرە هەوڵی جدی ئەوەش بدە،بەردەوام با شەربەت و ئاو و شیرینی یاخود خورما ئەمانە لات بن،عەلەل عەقەل با هەر دەست نەکەوت ئاو و خورماکەت لابێ،چونکە هەنێ جار هەیە،تۆ برنجت خواردووە،کە پێکهاتەی ئاڵۆزە و وزەکەی زوو ناچێتە مێشکتەوە وزەت نایاتێ،وە هەست دەکەی کە مێشت ماندووە و خەوت لێ ناکەوێ،بۆیە بە پەنا بردن بۆ یەکێک لەوانەی کە باسم کرد ئەوە حەل دەبێ،باشە،ئەوە حەل دەبێ،خۆم بەسەرم هاتووە نەک لە پۆلی ١٢ بەڵکو لە کات و شوێنی کەش،بەڵام بۆ پۆلی ١٢ هەموو ڕۆژێکە کە لە دەوام دێیتەوە،بۆیە دەشبێ بزانی کە چۆن زاڵبی بەسەری،یاخود بەکارهێنانی حەبی ڤیتامینەکان،ئەوەی کە دەیکەیتە ناو ئاوەوە،خۆی شی دەبێتەوە و تامی ئاوەکە دەگۆڕێ،زۆر باشە و وزەت ئەداتێ دەست بەجێ،لەخوێندا تێک دەشکێ و جەستە سودی لێ دەبینێ.

➔ پاشان با بڕۆینە سەر خاڵێکی کە،لەم کاتەیە بە حوکمی کەم بوونەوەی پارە،ئیحتیمالی بایکۆت هەیە،دەبێ تۆ هەر لە هاوینەوە حسابی خۆت بکەی و زۆرێک لە وانەکان تەواو بکە،محاوەلە بکە،هەر چەند دەتوانی زۆر تەواوە،بەڵام ناشکرێ و نابێ تۆ دوای ئەوە بپێچیتە پرسیاری وەزاری و کە حەلەکەیت

نەزانی ئیتر خۆت بێ هیوا بکەی،نا وا هەڵەیت بەڵکو تۆ بخوێنە،وە پرسیارەکانی وەزاری بە وەڵامەوە سەیر بکە وەک زانیاری زیادە،هەر تێبینیت دۆزییەوە لەسەری،لای خۆت بینوسە،با لات هەبێ،وە گەر دەوامیش دەستی پێ کرد ئاسایی تۆ گەر دەوام هەبوو،دەچییە دەوام،نەکەی بڵێی من لە موحازەرەی ئەو مامۆستایە ناچم ،چونکە هاوین تەواوم کردووە،هەڵەیە گوڵم هەڵەیە،لە بیری نەکەی هەڵەیە،ئەوە،نمونەمان لایە،کە ئەوە پلانکێ هەڵەیە،دواتر تۆ دەچییە ژورەوە وەرەقەی تێبینی لەگەڵ خۆت ببە ژورەوە،چونکە مامۆستا هەنێ جار تێبینییەک دەدا لەویا،دوو دەرەجەی بەناو چاوەوەیە،چونکە وەک فیکرە وایە بۆ تۆ،لە کتێب باس نەکراوە یاخود بە قورسی دەگەی پێی،تۆ دەبێ بجەنگی بۆ ئەو دوو نمرەیە،**لە بیری نەکەی...**

ئەوا بەردەوام دەبی لەسەر ئەم حاڵەتەیە لە کاتی دەوام،وە کێشەیەکی کەش هەیە کە ئێمە ڕووبەڕووی دەبینەوە،کاتێ یەکێ لە هاوڕێکانمان پێمان دەڵێ لەو کاتەیە کە سەعی پێ بکەین ئێمە پێی ناکەین و ئیهمالی دەکەین،بەحوکمی ئەوەی کە کاتی ئەوەت نییە،ئەمە هەڵەیە،بەڵکو دەبێ تۆ ئیش لەسەر **بۆ هاتنی فیکرە بکەی** ،کاتێ سەعی بەهاوڕێیەکت دەکەی،ئەو پرسیارێ دەکا،دەکرێ کە تۆ مێشکت بەلای نەچوبێ،بۆیە دواتر وەڵامەکەی لە مامۆستا وەردەگری و ئیسفادەی خۆی هەیە،وە نابێ کە حیقدت لە دل بێ،دڵنیابە لەو کاتەیە چەند کەسێ دەکرێ کە هەبن،بیانەوێ بتڕووخێنن، بەڵام تۆ دەبێ کە گوێیان پێ نەدەی وە ناشبێ کە تۆ بەو شێوەیە بی لەگەڵیان کە ئەوان مامەڵەت لەگەڵ دەکەن،یاخود بەهۆی ئەوانەوە شەرم بکەی پرسیار باش نەکەی لە مامۆستا

یاخود مەسەلەکە بە ناڕوونی بەسەرت تێ پەڕێ،بۆیە تکایە وریای ئەوەبە چونکە دەکرێ کە **٢ نمرەی بەچاوەوە بێ...**

کاتێ لەدەوام دێیتەوە،نان بخۆ وە ماندووشی لەو کاتەیە بۆیە خەوێکی خۆشی لێبکە،گەر خەوت هات،بەڵام گەر چوویتە سەر جێگا و هەستت کرد کە مێشکت ماندووە و خەوت نایە،ئەوە هەوڵبدە کە شیرین و شەربەت و خورما بەکاربهێنە،تا وزەت تیابێ و ئەو کاتەت نەڕوا،دواتر وەرە سەیری جەدوەل بکە بزانە بۆ بەیانی چ دەرزێکتان هەیە،سەعی تیابکە،و کاتی بۆ دابنێ،ئەویش بەگوێرەی سەعییەکەو تەرکیزی خۆت،بزانە چەند کاتی دەوێ، وە یەک شت لێرە زۆر گرنگە،ئەویش دەبێ لەو وانەیە دەست پێ بکەی کە حەزت پێیەتی یاخود هاوین بە باشی کردووتە،عادەتەن بیرکاری زۆر ئاسان و خۆشە هەرچەند ئەویش بۆ هەنێ کەس گرێ کوێرەیە،بەڵام گەر لەم وانەیە باش بووی هەمیشە سەرەتا لەم وانەوە دەست پێ بکە،و دواتر بپێچەرە وانەکانی کە،چونکە سەعی عادەتی وایە تا یەکەمجار دەستی ئەدەیتێ تۆزێ عەزییەتت ئەدا بەڵام دواتر زۆور زۆوۆر باش تێکەڵی دەبی و هەمووی بە باشی کۆنترۆڵ دەکەی،وە لە نێوان کاتی دەرزێک بۆ دەرزێکی کە پشوویەکی بچووک بدە بە خۆت،**هەناسەیەکی قوڵ هەڵبمژە با ٢ چرکە لەناو سییەکانت بمێنێتەوە دواتر بییە دەرەوە بە هێواشی وە هەوڵ بدە کە هەستت کرد ماندووی،ئەوا قاچت با بەرزتر بێ لەسەرت و وە ماوەیەک بەو شێوەیە بمێنەوە،تاوەک تەوژمی خوێن بۆ مێشکت زیاد بکا هیچ نەبێ هەنێ هیلاکی مێشکت کەم بکاتەوە و تەرکیزت باش بکاتەوە دووبارە**،لەو ماوەی ڕێستەدا دەبێ بیری ئیجابی بکەیتەوە،بیر لەو

لەحزەیە بکەوە کە گەشتووی بە ئامانجی خۆت و گەشتووی بە **دکتۆری** کە حەزت پێیەتی،وا خۆت ئامادە دەکەی کە کانۆلا یا دەرزی یا عیلاج بۆ نەخۆش دەنووسی یاخود لە سەیدەلْیێیەکدای عیلاج ئەدەی بە نەخۆش و بزە لەسەر لێوتە و ئەویش دووعای خێرت بۆ دەکات،و ئەمانە هەمووی کاریگەری هەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو سەعییە سودێکی باشتری هەبێ بۆت،دواتریش گەر هەر ماندووبووی بڕۆ سەیری تاکەکەت بکە کە ئەو هەموو قسە کاریگەرانەی تیایە و دەبێتە هۆی وزە پێدانت،دڵنیابە لەوەی کە خوای گەورە زوڵم لە کەس ناکا وە حەرامیشی کردووە لەسەر خۆی کە زوڵم لە خەڵکی بکا،بۆیە دڵنیابە بەرهەمی ئەو ماندووبوونەت بەهەدەر ناچێ،ناچێ،ئیرادە بە خۆبوون و بڕوابوون بەخۆ کە دەتوانی بە ئیزنی خوا ئەو فوول نمرەیە لە هەموو وانەکان بهێنی زۆر ئەساسە،هەتا خوێندکار هەبووە وتویەتی کە من بەشێوەیە هەوڵ ئەدەم لە هەموو وانەکان زیاد لە سەد بهێنم،پۆزشەکەشی ئەوە بووە،وتویەتی من دەزانم هەر کات خوێندکار هەوڵی ١٠٠ی دابێ ٩٤ بۆ ٩٨ی هێناوە من هەوڵ بۆ زیاد لەوە ئەدەم با ١٠٠ بهێنم،یانی بە کورتی هیچ تێبینی لە دەست خۆم نادەم و تەواو،هیچ شتێک ساردم ناکاتەوە،خوێندکاری سەرکەتوومان هەبووە،وتویەتی کە من بەشێوەیەک یەکەمی هەرێمم خستۆتە مێشکمەوە،بڕوا بکەن لەسەر نان،لەدوای نان،لە سەعی،لە ڕێست،هەمیشە لە یادم بوو،لە کاتی دوعا کردن،**وە لە کۆتایشدا پێکاویەتی**، بەڵێ ئەزیزم پێکاویەتی،جا بۆیە ئیرادە و ئەو هیوایەی کە هەتە،زۆر ئەساسە بۆ هێنانی نمرەی بەرز.

باسی سەعییەکانمان کرد،ڕۆژانە حەقی هەمووی بییە،هەموو نموونەکانی حەل بکە،**هیچ تەرک نەکەی لە خۆتەوە،هیچ تەرک نەکەی لەخۆتەوە**،مەگەر شتێ مامۆستا بڵێ ئەمە هەر لادراوە،و تەرکە،ئەگین لە خۆتەوە هیچ تەرک نەکەی،هەوڵ بدە کە زاڵبی بەسەر خۆتدا تا زیاتر خۆت لە وانەکان نزیک بکەیتەوە،مامۆستاکەت خۆش بووێ و وانەکەشت خۆشدەوێ،کتێبەکان و مەلزەمەکان وەک هاوڕێیەکی نزیکت سەیر بکە،وامەزانە دوژمنتە کاتێ دەیان بینی،واتە با هەمیشە وێنایەکی پاک و جوان لە وانەکان لە مێشکت بێ،هەر کات ئامانجەکەتت بیر کەوتەوە برۆ بۆ لای **هاوڕێکەت** و بکەوە باس و خواس لەگەڵی....

گەر بتوانی هەمیشە لە کۆتایی هەفتە موراجەعەی ئەو وانانە بکەیتەوە کە خوێندووتە **زۆۆر دەرەجە یەکە**،بگرە دەبێ بیکەیتەوە،بەڵێ بیکەوە زۆۆر زۆۆر بەسودە.

دەگێڕنەوە کە لەسەردەمی زێڕینی ئیسلامیدا زانای وا هەبووە لە ماوەی مانگێکدا نزیکەی سەد جەڵد کتێبی خوێندۆتەوە،وە تیایاندا هەبووە لە ماوەی یەک شەودا هەموو قورئانی خوێندۆتەوە،دەبینی کە شتەکە دەکەوێتەوە سەر خۆت،کاتێ کە چاو لەم زانایانە دەکەی،ئەوجا مەوزوعەکە ئاسان دەبێ بۆت،ئەوان لە ماوەی یەک مانگدا ئەو هەموو کتێبەیان خوێنۆتەوە کەچی خۆمان

تۆ بلێی نەتوانین کە لە شەوێکدا **٢٠ لاپەڕە** بخوێنینەوە،یاخود نەتوانین کە لەبەری بکەین،ئیمامی بوخاری دەگێڕنەوە لێی کە بۆ لەبەر کردنی هەر شتێک، تەنها یەک جاری پێویست بوو تاوەک لەبەری بکا و لەبیری نەچێتەوە،وە ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل هەزار حەدیسی لەبەر بوو،ئەمە هەمان ئەو مێشکەیە کە لەسەر تۆیە،بەڵام خۆمان بەکاری ناهێنین،**دەی کەی کاتی ئەوەیە بەکاری بهێنی ؟؟؟**

زانایان دەڵێن گەر مرۆڤ بۆ ماوەی زیاد لە سەدساڵ،شتێکی وایە،گەر سەیری فیلم بکا بێ وەستان مێشکی جێگەی هەمووی تیا دەبێتەوە،وە هەمووشی لەبەر دەکا،بەڵام ئەوە خۆمانین کە لەبیری دەکەین،ئەوە خۆمانین کە ئیهمالین وسیقەمان بەو مێشکە،یاخود میمۆرییە زەبەلاحەی خۆمان نییە و هەمیشە بە لاوازمان زانیوە،ئیرادەمان نییە،بۆیە دەبێ ئێسا بگەی بەو حەقیقەتە و نابێ زوڵم لە خۆت بکەی،دەبێ بەکاری بهێنی،ئیتر کاتییەتی،پۆلی ١٢ دەبێتە سەرەتاییەک بۆی.

➔من هەوڵ دەدەم لەم ڕێگەوە ژیانێکی پڕ هیوای لە ناختدا دروست ببێ،باکت بەوە نەبێ کە چی لەدەرەوە ڕوو ئەیا،چیت پێ دەڵێن، هیوا و ئومێد سفرە،دەبێ تۆ لەو ژینگەی کە لە ناختدایە،بژی،وە کاتی ئەوەت نەبێ کە باسی داهاتوو بکەی **دائەمەزرێم دانامەزرێم،داهاتوو پەنهانە بۆ من و بۆ تۆش**،کۆتا لەحزەی مەکتەبت و هەموو هەوڵ و ماندووبوونت **وەرگرتنەوەی ئەنجامی کۆتایی پۆلی ١٢ییە**،تکایە وریابە وریابە،هەوڵی ١٢ ساڵت بە هەدەر نەڕوا،و دڵنیاشبە لە خۆت کە سەرکەوتوو دەبی...

بەهەر حاڵ،لەو شوێنەی کە بەر چاوییە بۆ خۆت و زۆر ئەدەی بەلایا،هەوڵ بە ئەو ئەنجامەیە بنووسە کە دەتەوێ بیپێکی،بنوسە ١٠٠،خۆ ناتکوژن ،ئازیزم بەجدیمە،یاخود ناوی هەموو وانەکان بنوسە و پاشان بۆ هەر هەمووی ١٠٠ دابنێ،هەوڵبدە خەویکی باش بکەی لەشەو ڕۆژدا،گرنگ خۆتی چ وەختێکت حەز پێی بوو ئەو کاتە سەعی بکە،بەڵام بەرەبەیان بەسودترە،ئیتر گەر ئەو کاتەش نەتوانی ئاساییە،گەر ڕۆژێک هەستت بە تەواو بێ هیوای کرد،هەوڵ بدە ئەو هاوڕێیەت کە باسم کرد با بەردەوام تەشجیعت بکا،بەس ئەو پۆلی ١٢ی تەواو کردبێ،وە لە بەشێکی بەرز بێ،گەر ئەویش نەکرا ماموٚستایەک با هەموو نهێنییەکانت بزانێ کە چۆن هەوڵ دەدەی،گەر ئەویش نەبوو،بزانە چ خوێندکارێک ئاستی زۆر لە تۆوە نزیکە یا تۆ لەو نزیکی باسی ئامانجتان بۆ یەک بکەن،وە لەو کاتەش پەیوەندی پێوە بکە،باسی ئەو کاتە بکەن کە دەگەن بە ئامانجی خۆتان،یاخود هەنێ قسەی سوعبەت و خۆش بکەن تا ماندووبوونتان بڕەوێتەوە.

➡دکتۆر نەجیب کە من لە بواری توبدا پێی موعجیبم قسەیەکی هەیە دەڵێ:
**ڕێگە مەدە کە ڕابردووت پێناسەی داهاتووت بکا (واتە گەر لە ڕابردوو زۆر شکستت خواردووە ئەمە مەکە پێناس بۆ داهاتووت )بەشێوەیەکی دوا نەهاتوو ئیش بکە بۆ گەشتن بە ئامانجەکەت،وە باوەڕت بە خۆت هەبێ (بە توانا شاراوەکانی خۆت هەبێ )،ئامانجێک دانێ کە هانت دەدا،گەر وا هەست دەکەی و ئەتەوێ واز بهێنی،تەنها بیر لەوە بکەوە بۆ سەرەتا دەست پێ کرد.**

✍لێرەوە من دەمەوێ ئەوە بڵێم،گەر تۆ هەر سووری لەسەر دۆڕانت و لەسەر ئەوەی کە تۆ هەردەم دۆڕاویت و ناتوانی کە بگەی بە ئاستی بەرز،تەنها بیر لەوە بکەوە بۆ دەست دا بە خوێندنی ئەم کتێبە،دیارە تۆ لە ناخت حەزت بەوە هەیە کە نمرە بێنی و توانای ئەوەشت هەیە،وە بەڵگەشم بۆ ئەمە،بریتییە لە محاوەلە کردنی تۆ بۆ زانینی چۆنیەتی خۆ ئامادەکردن بۆ پۆلی ١٢،کەوایە زوڵم مەکە،لە خۆت،ئەو هەلەش بدە بە خۆت،دڵنیابە بە ئیزنی خوای گەورە سەرکەوتوو دەبی و سەرەتاییەک دەبێ بۆ سەرکەوتنەکانی دواترت......

✍سەیری ئەم وتانەیەش بکە:

ئەنیشتاین دەڵێ: دوو ڕێگا هەیە بۆ ئەوەی بژی لە ژیان،یا ئەوەی هیچ شتێک بە موعجیزە نەزانی بۆ بەدەستهێنان،یا هەموو شتێک موعجیزەیە بۆ بەدەستهێنان و کردن...

واتە:بەگوێرەی بەشەرەکەیە،وە بەگوێرەی شێوازی لێڕوانینی تۆ بۆ شتەکان،وە قسەیەکی کەشی هەیە ئەنیشتاین ئەڵێ:گەر مەوزوعێکت زانی و خۆت وا دەرخست کە دەیزانی،بەڵام نەتدەتوانی کە بە زمانێکی سادە دەری ببڕی،دڵنیابە کە باش لێی تێنەگەشتووی.

هەر کەس هەڵەی نەکرد،ئەوە هەرگیز ئەو کەسەیە ئیبداعی لانییە،جا بۆیە ڕۆژانە هەوڵبدە کە هەموو کویزەکانت دەرەجەی تەواو بێ بە ئیزنی خوا،بەڵام گەر

دانەیەکیان نمرەیە دوو نمرە خوار بوو،ئەوە تۆ لێرە قازانجێ دەکەی،**ئەویش وەرگرتنی فیکرەیەکی نوێیە لەو هەڵەیە**،بگرە بۆ جارێکی کە تەرکیزت فراوان دەبێ و ئەو هەڵەیە دووبارە ناکەیتەوە ....

ئینجا ئەڵێ:**وێناکردن زۆر زۆر گرنگترە لە زانست**،هیوادارم قوڵ بڕۆیە ناو ئەم قسەیەوە.

خوێندکار هەبووە،ڕۆشتووە،دەنگی تەسجیل کراوی خوێندکاری یەکەمی هەرێمی ساڵێ پێش خۆی تەسجیل کردووە لە مۆبایلەکەی،وە دواتر لە موبایلەکەی دایناوە بەردەوام لێی داوەتەوە،وە تەشجیعی خۆی پێ کردووە،وە بەشێوەیەک قوڵ بۆتەوە لە ماناکەی،وای لێهاتووە زاڵ بووە بەسەریدا،لەجیاتی ئەو زەلامەیە،خۆی داناوە و وا حسابی کردووە کە ئەوە خۆیەتی و کۆتایی ئەم ساڵە و قسە بۆ ئیعلام دەکا،واتە یەکەمی بەدەستهێناوە.

**لە کاتی عوتڵەکان چی بکەم؟یاخود گەر سەعیم تەواو بوو چی بکەم؟؟هەروا دانیشم ؟؟**

بۆ ئەو کاتەی کە لە پشووەکاندای،وە ترسی ئەوەت هەیە،کە کاتت بڕوا،تۆ دەتوانی کە چەند شتێ بکەی،یەکێ لەوانە موراجەعەی خولی یەکەم،بەڵام لەوەیە ئەمە بێزارکەر بێ بەحوکمی ئەوەی کە تازە ئینتیحاناتتان تەواو بووە و تۆش

تاقەتی ئەوەت نییە کە بڕۆی بیکەیتەوە،ئەمە تووشی بێ تاقەتیت دەکا تا ڕاددەیەک،بەڵام گەر بەهۆی عوزرێکەوە دوا کەوتبوو،دەبێ لەو ماوەیە بیکەی،پاشان بۆ دانەیەکی کە،تۆ بەردەوام لەبەرکردنی ئەدەبی کوردی،ئەدەبی عەرەبی یاخود ئاین و ئەمانە هەمووی بەردەوام پێویستی بە موڕاجەعە هەیە و دەبێ بە وردی لەبەری بکەی،بۆیە تۆ دەتوانی کە لەو ماوەیەدا خۆت بەوانەوە مەشغوڵ بکەی و بیکەی،هەم بەسوودە وە هەم بۆ خۆشت ئیسراحەتێکە،وە دەشتوانی ڕۆژەکەی کە گەر بتەوێ وانەیەک تەواو بکەی،من وەک خۆم دەفتەرم بۆ وانەکانی فیزیا و کیمیا و بیرکاری و عەرەبی و کوردی هەبوو،وە هەموویم لەویا حەل دەکرد،وە وانەی ئەحیاش هەرچی شەرحیاتی تیابوو بەجوانی و بە تێگەشتنەوە لەبەرم دەکرد و وە دەشم نوسییەوە،وە گەر لەو ماوەیەش ئیسراحەتێ بەیت بە خۆت و سەیران و گەڕانێ بکەی ئیسفادەی زۆر باشی دەبێ....

هەموو وانەکان،دەبێ بێ کەموکوڕتی تەواو بکەیت،وە دوای تەواو کردنی هەموویان بەروارەکەی لەسەر بنوسە،وە کتێبەکە،کە دات خست،نایکەیتەوە تاوەک موڕاجەعەی عامی هەموو وانەکان،کە نۆڕماڵی لە مانگی ٤ و کۆتایی ئەم مانگەیە دەست پێ دەکات،دەبێ هەموو ئەسیلەی ساڵەکانی پێشووت لابێ،یاخود دەکرێ،کە مامۆستاکەشت هەموو ئەسیلەکانی لە مەلزەمەکەیا کۆکردبێتەوە و داینابێ،ئەمە شتێکی ئاساییە،و بگرە زۆریان ئاسانکارییە بۆت،بۆ هەر وانەیەک هەر وەک لەسەرەتاوە وتوومە،هەرچی گومان دەبەی بێتەوە تیایدا،دەبێ ئەو سەرچاوەت بەردەست بێ،لەگەڵ مامۆستای هەموو وانەکان بدوێ و قسەیان

لەگەڵ بکە کە تۆ ناتەوێ تەنانەت نمرەیەکیشت بڕوا،بۆیە با ئەوان هەمیشە لە ئەپدەیتی تازە و نوێکاری،گەر ڕوویدا،ئاگادارت بکەنەوە...

ئیتر کات دەڕوا تاوەک دەگەیە عوتڵەی بەهار و هەوڵ بە لەو ماوەیە،بزانە دەتوانی بەس تەنها یەک موڕاجەعەی ئەو وانانەی خولی دووەم هەمووی بکەیتەوە،زۆر بەسوودە و ئاسانکارە بۆت،ئەمانە گەر بیکەیت،دواتر یەک بە یەک کتێبەکان دابخە،وە هەوڵبە **کە ئینتیحانی کۆتای ساڵی وەرزی دووەم مەکەوە**،ئەو هەموو کاتەت بۆ دەگەڕێتەوە و خۆت بە موڕاجەعەی گشتییەوە،مەشغوڵ بکە،و پلانێکی ورد دابنێ و بزانە چەند ڕۆژت لەبەردەستە،کاتەکان بە پێی وانەکان دابەش بکە،مەسەلەن یەکەم وانە ئەحیایە،با کۆتا وانە کە موڕاجەعەی دەکەیەوە ئەحیا بێ،وە هەمیشە،کە کاتت داننا،با یەک هەفتەی کۆتایی،پێش ئینتیحانات هەوبێ **چونکە ئەمە زۆر ئەساسە**،هەنێ جار هەیە حاڵەتی ناشاز درووست دەبێ ناتوانی کە هەمووی تەواو بکەی،وە کاتی زیاترت دەوێ،بۆیە با ئەو هەفتەت لەو لاوە هەبێ،پاشان دەشکرێ کە تۆ بتوانی زیاد لە یەک جار لەو ماوەیە هەموو وانەکان تەواو بکەی ئەمە شتێکی ئاساییە،**وە هەوڵ بدە لەسەر دیواری ئەو ژوورەی کە سەعی تیا دەکەی،بەش بەشی بکە،مەسەلەن بەشێ بۆ وانەی فیزیا،لەژێر ئەودا هەر تێبینییەک زانیت کەوا گرنگە بینوسە،تاوەک بیرت نەچێتەوە و تەواو لەبیرت بێ.**

وە دەشتوانی وەک گەمەیەک یاخود جەو وەرگرتنێکی خۆت،لەژێر هەر بابەتێک ڕەقەم دابنێ لە **یەک تاوەک ١٠**،هەر ڕەقەمە و دەلالەتە لە ڕۆژێ،کاتێ ئەو ڕۆژە هەموو ئەرکەکانت بە باشی تەواو کرد،سەحێکی لێبدە،وردە وردە هەمووی دەڕوا،وە گەر وانەیەک تۆ ٨ ڕۆژت بۆ داناوە،کەمی کرد بۆ ٥ ڕۆژ،ئەو دوو ڕۆژەیە مەوەستە تاوەک کاتی ئەسڵی تێپەڕ دەبێ،بپەڕە سەر دەرزی دواتر با ژمارەی ڕۆژەکانت لە کۆتایی زیاد بکا و بۆ خۆت بەسودە،بەلاّم نەکەی ئەوەنە پەلە بکەی حەقی وانەکان نەدەی،لە حەیبەت هەبوونی ڕۆژ لە کۆتاییەوە،ئەمە هەڵەیە بەڵکو هیچ پەلەیەک لە خۆت مەکە و بە ئیسراحەتی خۆت تەواوی بکە،زۆر نان مەخۆ تاوەک خەواڵو نەبی یاخود زۆر تینووت بێ و دواتر ئاو زۆر بخۆیەوە و دواتر حەزت بە خەوە و کاتێکی زۆرت دەڕوا و دواتریش کە هەڵدەستی لە خەو جسمت قورسە و تاقەتی سەعیت نییە،ئەوەنە بخۆ کە سەعیت کرد،داڵغەت لای خواردن نەبێ،ئەوەنەش بەش بهێڵەوە کە بە ئارامی هەناسە بەیت، یاخود میوە و شیرینیت پێ بخورێ،لەو ماوەیە زۆر ئاگاداری تەندروستیت بە و ددانت باش بشۆ پێش خەوتن،نەک ئەو شیرینییە کلسی بکا و دواتر چەند ڕۆژێکت بڕوا بەبۆنەی ئازار و سەردانی دکتۆری ددانەوە،وە کاتی سەعی کردنەکەش بەگوێرەی خۆت کەوتووە بەلاّم سەعی بەرەبەیان زۆر باشە و دەشتوانی وەک شتێکی لاوەکی کاتی سەعیت هەبێ.

مەسەلەن پلانت هەیە کە سەعات ٤ی بەیانی دەست بکەی بە سەعی،هەتا ١١ی نیوەڕۆ،وە لەو نێوانەش هەمووی ئیسراحەت هەیە،نانی بەیانیش باش دەخۆی وە گەر درەنگتر هەڵسای لە خەو درەنگتر دەست هەڵبگرە،یاخود دەزانی کە کەم

سەعی هەیە قەینا با جەستەت تۆزێ لەززەت لەو خەوەیە ببا،لەو کاتەیە کە مێشکت ماندوو دەبێ هەست بە بێتاقەتی دەکەی.

**وە گەر زۆر باش سەعی بکەی و خۆت ماندوو بکەی،بەردەوام ناخت ئەدوێ لەگەڵت کە تۆ ناتوانێ ئەو نمرەیە بەدەست بهێنی،ناتوانی ئەو نمرەیە بەدەست بهێنی،یاخود گەر سەرنەکەوتی چی،**ئەمەش دەبێتە هۆی شلەژانت،تکایە تکایە ساردت نەکاتەوە،ئەوە هەمووی بەسەری هاتووە،هەمووی بەسەری هاتووە و بەسەری دێت،بۆ حەلکردنی ئەم شلەژانییە،هەوڵ بدە کە گوێ لە قورئان بگرە بە دەنگێکی هێور و هێدی،گەر بیرت مابێ وتم ڕۆژانە کە هاتیتەوە،بنوسە سەعات ئەوەنە بۆ ئەوەنە سەعی ئەو وانە دەکەم،با کاتی پشووی تیانەبێ،چونکە بتەوێ و نەتەوێ گەر ٢ سەعات بنوسی ئەوە دڵنیابە لەوە تۆ بە یەک سەعات و نیو تەواوی دەکەی و ڕێستێک و دەپەڕییە موحازەرەی دواتر،یاخود کاتی نوێژە نوێژەکەت دەکەی،دەبینی کە لە وانەیەک چەند دەقەیەک دوا دەکەوی،ئەم نوێژەیە بەرەکەتی تێ دەکا،بەڵام بە بینین وایە بەهەر حاڵ،با کاتی ڕێستی تیا نەبێ چونکە بتەوێ و نەتەوێ هەر وانەیەک ٢٠ خولەک کەمتر زیاتر پێش وادەی خۆی تەواوی دەکەی،ئیتر وردە وردە کاتت لێ دەڕوا و تۆش پلانی خۆت جێ بەجێ دەکەی.

تەرکیزت لەسەر ئەوەنەبێ،خوایە کەی وزاری دێ ومن بێزارم لە چاوەڕوانی،دڵنیابە هەر دێ،هەوڵدە تەرکیزت لەسەر ئەوە بێ،کە تۆ چۆن خۆتت بۆ ئامادە کردووە،دڵنیابە،لەززەت و تامی هێنانی نمرە یەکسانە بە ماندووبوونی

هەموو ساڵەکە و عەزییەت بوونت،تا زیاتر ماندوو بی زیاتر نمرەی بەرزتر بەدەست دەهێنی،وە یەک شتی کەشت بیر نەچێ،کاتێ هاوڕێیەکت جیا لە پلانی تۆ سەعی دەکا و زۆر جیاوازە،ئاسایی بێ بەلاتەوە،هەر کەسەو پلانی خۆی،خۆت بەو بەراورد مەکە،وە هەوڵ مەدە کە پێت ناخۆش بێ سەعی دەکا،چونکە ئەو کات مۆڕە لە یەک دەکەن،دواتر دەگۆڕێ بۆ ڕق و لەوێشەوە بۆ حەسودی و منافەسەی هەڵە،بەڵام گەر هاوڕێی خۆت هەبێ لە نزیک یەک بن و ئاسایی وەک دوو برا بن و هەوڵ بەن هەردووکتان نمرەی بەرز بێنن، بەڵام تۆ زیاتر،بێ ئەوەی کە هیچ حیقدێکت لا درووست بێ،ئاساییە،وە ئاسایی بێ بەلاتەوە،بگرە ئەو موونافەسەیەش بەسوودە.

✍کات دەڕوا و تۆش بەردەوام خۆت ئامادە دەکەی بۆ تاقیکردنەوەکان،بۆیە گەر لە کۆتاییەوە کاتت بۆ ماوە،کە دڵنیاشبە دەمێنێتەوە و پێش وادەی خۆی تۆ وانەکان تەواو دەکەی،بەڵام بە دوو مەرج،**یەکەم ڕۆژانە بەو شێوەیەی کە پێتم گوتووە بیکەی،وە دووەم ماوەی سەعی گشتییەکەت زیاد لە ٥٠ ڕۆژ بێ**،وە لە کۆتایی هەر کتێبێک سەرجەم پرسیارە وزارییەکانی ئەو وانەیە حەل بکە،وە گەر هەر پرسیارێکت بۆ درووست بوو،ڕاستەوخۆ دەینوسی ،تکایە تکایە،نەکەی هیچ پرسیارێ ئیهمال بکەی کە دەینوسی،هەمووی بنووسە،دواتر لە کۆتایی وانەکا،بڕۆ سوئاڵ لە مامۆستای بابەتەکە بکە و وەڵامی وەرگرە،هەموو وانەکان بەو تاکتیکەیە دەڕوا تا هەمووی تەواو دەکەی بە جوانترین شێوە،وە وانەی

کۆتایی کە تەواوت کرد با **٣ ڕۆژ پێش ئینتیحانی وزاری بێ** و دواتر دەست بکە بە موراجەعەی وانەی کۆتایی بۆ هۆڵی تاقیکردنەوە......

**✍ئەو شتانە چین کە مێشک بەخۆیەوە مەشغوڵ دەکا و خوێندکاری پۆلی ١٢ سارد دەکاتەوە؟؟...**

هەبوونی دەنگۆی فرۆشتنی پرسیارەکان،تکایە تکایە پێی هەڵمەخەڵەتێ،نەهێنانی نمرە بەهۆی ئەم هۆکارەوە،بیانوویەکی زۆر منالآنەیە،کاکە هەمووی درۆو دەلەسەیە،هەموو ساڵێک وایان گوتووە کەچی ڕاستیش دەرنەچووە،وەک دەڵێن پرسیارەکان پێش تاقیکردنەوە دەفرۆشرێن،یاخود وەلآمەکانیان بۆ دەنێرن بە موبایل،یاخود سایتی پەروەردە هاک کراوە و هەموو وەلآمەکان ئاشکرا کراوە،تەلەبەیەکی زۆر نمرەی تەواوەتی هێناوە،کە دێیتە دەرەوە لە ئینتیحان هەمووی باس باسی پرسیار فرۆشتنە،تکایە با سەرت لێ نەشێوێنێ،مەعقول نییە تۆ ساڵێکە بەر بەرەکانییە دەکەی و ئێسا بەهۆی ئەو بیانووەوە کۆڵبەیت و بکشێیتەوە ......

بوونی پەیوەندی هەست و سۆزی،یاخود بردنی ئەسیلە و وەرگرتنی ئەسیلە لە خوێندکاری ڕەگەزی بەرانبەر بە بیانووی سەعی،هەڵەیە،هەڵەیە،کاکە گەر زانیت خوێندنگایەک مامۆستاکەیان زیرەکە پرسیارەکانیان لە وزارییەوە نزیکن،ئەوە

دەبێ،لە ڕێگەی خزمێکتەوە وەری بگری،چونکە درووست بوونی کەپڵایەتی،لەو کاتەیە مێشک بەخۆیەوە مەشغوڵت دەکا و هەرچەند سەعی بکەی هەر داڵغەت لە شوێنی کەیە،وەک بەرمیلێ وایە **لەسەرەوە ئاوی تێبکەی بەلوعاکەشی لەخوارەوە کرابێتەوە** ...

دواتر ترسان لەوەی ئەو مەلزەمەی کە بەکاری دێنی مامۆستاکەت زیرەک نەبێ،**بەڕێزەکەم** بڕۆ بپرسە بزانە کام مەلزەمە،فوول مارکی تیا هاتووە لە کاتی هەڵبژاردن،ئەوە بەکاربهێنە،یاخود مەسەلەن مامۆستاکەت گەر مەلزەمەی هەبوو تەنها مەلزەمەی ئەو بەکار بهێنە و مەپێچە هی کەسی کە،چونکە سەرقاڵت دەکا و کاتت دەبا،مەگەر ئەلاهومە مامۆستایەکی کە،مەلزەمەیەکی داناوە بەڵام هەنێ زیادەی تیایە لەوەی مامۆستاکەت نییە،تۆ دەتوانی کە ئەو مەلزەمەیە بە دەست بخەی،**تەنها لەبەر زیادەکە نەک لەبەر شتی کە**......

ترسانت لەوەی کە لای خەڵکی باس بکرێی کە ئەمساڵ سەعی دەکا و گاڵتەت پێ بکەن،گەر دواتر نمرەت نەهێنا،من پێت دەڵێم واز لە قسە و باسی خەڵکی بێنە،چی دەڵێن با بیڵێن،تۆ بەرەو ئامانجی خۆت مل دەنێی،وە دڵنیاش بە دەیپێکی،چونکە تۆ بەردەوام داوا لە خوای گەورە دەکەی،وە ئەویش هەموو شتی لە کۆنترۆڵە،هەموو شت،وە خۆی خاوەنییەتی،کەواتە ئەویاتێ (**گەر ڕاستگۆبی** ).

لەکاتی بینیی پرسیارێک کە وەڵامەکەی نازانی،ڕاستەوخۆ خۆت بێ تاقەت بکەی بەوەی کە سەعی بە تەرکیزەوە ناکەی یاخود شتێکی کە،کە وات لێ بکا مەئویس بی و لاواز بی،شتەکە ئاسایی وەربگرە،لەو کاتەی کە دیتت،هەوڵبدە کە بەدوای وەڵام بگەڕێ،وە سپاسی خوا بکە کە شتێکت دیتوە تا ئێسا نەوزایوە،ئەو شتانە بەسەر هەمووی ڕوو ئەدا،بۆیە با ئاسایی بێ بەلاتەوە،وە ورەت زیاد بکا نەک بڕوخێ ..

کاتێ هەنێ خوێندکار باسی مەوزوعێ دەکەن،تۆش ماوەیەک دەبێ،کە موراجەعەت نەکردووەتەوە یاخود ماوەیەکە تەواوت کردووە وە تەرکیزت لەسەر بابەتێکی کەیە،ئاساییە نەیزانی و نابێ گەر وەڵامەکەت نەزانی،سەر لە خۆت بشێوێنی و خۆت بەلاوە کەم بێ و لۆمەی خۆتی لەسەر بکەی...

دەکرێ هەنێ جار ئەسیلەی خوێندنگای دیکە بهێنی،وە زۆر ئاڵۆز بێ و نەتوانی باش حەلی بکەی،بەڕێزەکەم،خۆی وزاری زۆر ئاسانە و ئەو قورسییەی تیا نییە،بەڵام مامۆستاکە بەحوکمی ئەوەی دەیەوێ کە تۆ سەعی زیاتر بکەی،ئەو ئەسیلە قورسانە دەهێنێتەوە،وزاری هەموو پرسیارەکانی هی کتێبە و ڕوونە،**شڵەژان و ترسانی تەلەبە و سترێس لەسەری وادەکا کە،دوای ئەو هەموو سەعییە نمرەی کەم بهێنێ،گەر نەترسای،دڵنیابە زۆر بە ئاسانی ئامانجی خۆت دەپێکی**،بۆیە هەر لێسەوە وامەزانە کە چوون بۆ ئینتیحانی وزاری واتە

جەنگ و شەڕ و شتی وا،شتەکە ئاسایی وەرگرە،خۆت مەترسێنە،دڵنیابە ئامانجی خۆت دەپێکی....

کاتێ دێیتە دەر لە ئینتیحان،دەبێ پێشتر لەماڵەوە هەموو ئاسەواری کتێبی ئەو وانەت نەهێشتبێ،بە ماڵەوە بڵێ،هەر کە تۆ دەرچووی بۆ ئینتیحان،هەموویت لێ هەڵبگرن وە نەشت دەنەوە گەر زۆر داوات کرد،چونکە ئەو ٣ هەفتەی ئینتیحانات دەبێ زۆر ئاگاداری خۆت بی،دەزانم شڵەژانی هەیە ،ماندووبونی هەیە،عەزییەتت دەدا،بەڵام سەبر وئارام بگرە،کە هەر ئەو جارە نەجاتت بوو بۆ هەتا هەتاییە ئەو شەهادە و نمرەیە دەلکێ پێتەوە و لێ نابێتەوە....

نابێ لە دوای کردنی ئینتیحان،دەرەجەی خۆت حساب بکەی،یاخود چەند سەعاتێکی خۆت ببەی بە گەڕان بەدوای ئەسیلەکانەوە و تا بزانی چەند دێنی،ئەمانە هەڵەن،**چونکە باش بووی یا خراپ بووی تازە ڕۆشتووە**،لەو کاتەیە هەنێ سترێست لەسەرە،دەکرێ باسی مەوزوعێ بکەن تۆ بە ئاسانی لە وزاری جوابت داوەتەوە و ڕاستە،بەڵام تەلەبەکان وردی دەکەنە و ئەوها و ئەوهایە و تۆش دەکەویە گومانەوە و تا کۆتایی،ئەمانە هەڵەن،چونکە تۆ دەشڵەژێی لەبەر شتێک کە وەڵامەکەشت ڕاستە،ناتوانی بۆ ڕۆژی دواتر باش سەعی بکەی،بەردەوام لە داڵغەی..

هاتییەوە لە ئینتیحان یەکسەر بخەوە و ئیسراحەت بدە بە خۆت،دواتر کە هەڵسای لە خەو،دەست بکە بە سەعی ئینتیحانی ڕۆژی دواتر،وە هەرگیز لە یاد نەکەی،کە گرنگترین تێبینییەکان باش موڕاجەعە بکەوە و لە یادی نەکەی،وە هەر مەوزوعێ دەزانی گرنگە بەڵام بەردەوام لە یادت دەچێ،تەرکیز بکە سەری و لە یادی مەکە،چونکە دەکرێ هاتبێتەوە و تۆش نابێ یەک هەڵبژاردن ئیهمال بکەی...

✍لێرەیا دەمەوێ کە هەندێ نمونەی جوهد و تێکۆشانی زانایان بهێنمەوە لەو نوسراوانەی کە لەماوەی ژیانیاندا نوسیویانە،تاوەک ئەو گرێ کوێرەی مێشکت بکرێتەوە و واز لە ڕۆشتن لەسەر ڕێگای خاو بهێنی و بێیتە سەر ڕێگای سەریع و جوهد و تێکۆشانی ئەو زانایانە ببینی......

1. فەخرەدینی ڕازی تەمەنی تەنها ٦٣ ساڵ بووە و ٢٠٠ دانراوی لەدوای خۆی بەجێماوە،وەک تەفسیرە بەناوبانگەکەی کە ٣٢ جزم بووە و دانراوی وەهاشی هەبووە کە چەند پەڕەیەک بووە.

2. ئیبنولجەوزی کە خۆی دەڵێ:**بەو دوو پەنجەی دوو هەزار بەرگ کتێبی نووسیوەتەوە**،ئیبنو ڕەجەبی حەنبەلی دەربارەی دانراوەکانی دەڵێت:بەشێک نەبووە لە بەشەکانی زانست،ئیبنو جەوزی دانراوێکی گەورە یاخود بچوکی تیا نەبوو بێت،بەجۆرێک دانراوەکانی لە ٣٥٠ دانراو تێپەڕبوون.

3. ئیبنو تەیمییە کە تەمەنی ٥٧ ساڵ بووە دانراوەکانی ئەوەندە زۆر بوون خۆشی ژمارەیانی نەزانیوە.

4. ئەبولحەسەنی ئەشعەری تەفسیرێکی بووە بە ناوی المختزن کە ٧٠ بەرگ بووە.

5. ئیبنولجەوزی کە ئامۆژگاریی کوڕەکەی دەکات،پێی دەفەرموێ:کوڕم ڕۆژ کە دەست پێ دەکات،بە سەعات دەست پێ دەکات،سەعاتیش بەسەر هەناسەدا دابەش دەکرێ،هەموو هەناسەیەکیش گەنجینەیەکە،ئاگاداری خۆتبە،هیچ هەناسەیەکت بە خۆڕایی نەڕوات،وە لە ڕۆژی قیامەتدا گەنجینەکەت، خاڵی بێت و پەشیمان بیتەوە،کە پەشیمانی دادت نادات.

6. حافیزی مونزیری کە یەکێک بووە لە زانا ناودارەکانی جیهان،چەندین کتێبی گەورەی دوای خۆی جێهێشتووە،دراوسێیەکی دەڵێ،١٢ ساڵ دراوسێی بووم ماڵم بەسەر ماڵەکەیەوە بوو،هەر کاتێک بەشەو خەبەرم بۆتەوە دیومە کە چراکەی گڕاوە و خەریکی خوێندنەوە و نووسین و فێربوون و بڵاوکردنەوەی زانست بووە،تەنانەت لە کاتی نانخواردنیشدا، کتێبەکەی لەلای بووە و ئیشی تێدا کردووە و نە بۆ پرسە و نە بۆ نەخۆشی نە بۆ سەیران و خۆشیی،بۆ جومعە نەبێت لە مەدرەسە نەچۆتە دەرەوە.

7. خەلیلی کوڕی ئەحمەدی فەراهیدیی کە یەکێک بووە لە بلیمەتەکانی جیهان و خاوەنی دانراوی نایاب بووە، دەڵێت:گرانترین و سەخترین کات و سات بەلامەوە،ئەو ساتەیە کە نانی تیا دەخۆم،واتە ئەو کاتەش کە بۆ نانخواردن خەرجی دەکات بەلایەوە کاتێکی زۆرە.

8. لە عوبەیدی کوڕی یەعیش گێڕدراوەتەوە،کە ٣٠ ساڵ بە شەو خۆی نانی نەخواردووە بەڵکو خوشکەکەی پارووی کردووە بە دەمییەوە و ئەو بۆ خۆی خەریکی نوسینەوەی حەدیس بووە.......

Big dream..........

وغدا سيكون أجمل البداية بإذن الله تعالى،لذالك لا تقلق لأي شيء.

چاوەڕێی جوهدتانین.......

سەرکەوتوو بن....